بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله رب العالمين

والصلاة والسلام على رسول الله الأمين

محمَّد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد

وَاعبُد رَبَّكَ حَتّى يَأتِيَكَ اليَقين

**بزانه رەحمەتی خوات لێبێت کە ئەمەی بەردەستت وەك دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو فیقهەوە. کە تیایدا بابەتە سەرەکییەکانی فیقهم باسکردووە بە پوختی و بێ خۆبەستنەوە بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە لە مەزهەبە فیقهییەکان و بێ هێنانەوەی بەڵگە لە قورئان و فەرموودە و کۆڕا. موەفەق بیت لە فێربوونیاندا.**

# یەکەم / فیقھ

## فیقھ چییە؟

تێگەیشتنە لە وتەی خوای گەورە و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بەو شێوەیەی کە خۆیان ئەیانەوێت.

## بابەتەکانی فیقھ چین؟

بابەتەکانی فیقھ بریتین لە عیبادەتـەکان وەك: دەسـتنوێژ، نوێـژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، جیهاد. وە مامەڵەکان وەك: فرۆشتن، میراتی، نیکاح، تەڵاق. وە تاوان و سـزا شەرعییەکان وەك: دزی و دەستبڕین، زینا و جەلد کردن، پیاوکوشـتن و قیصـاص، هەڵگەڕانەوە لە دین و کوشتن. وە داوەری کـردن لـە نێـوان خـەڵکی و گێڕانـەوەی مافە خوراوەکان و جێبەجێ کردنی سزاکان.




# سەرچاوەی وەرگرتنی فیقھ چییە؟

سەرچاوەی زانینی عیبادەت و مامەڵە و تاوان و سزا و داوەریكردن بریتییە لە دەقی قورئان و فەرموودە وە كۆدەنگی زانایانی شەرع. وە لە حاڵەتێكدا گەر بابەتێكی دیاریكراو دەقێكی ڕاست و ڕوون یان كۆڕای زانایانمان دەستنەكەوت لەسەری، ئەوكاتە بەپێی بنەماكانی فیقھ (أصول الفقه) زانایان قسە لە بابەتەكەدا ئەكەن و فەتوا ئەدەن. بەمەرجێك كە فەتواكەیان پێچەوانەی دەق یان كۆڕا یان بەڵگەنەویستێكی دین نەبێت.

# بۆچی فیقه بخوێنم؟

چونکه:

١. خـوای گـەورە بـۆ پەرسـتنی خـۆی دروسـتیکردوویت، جـا ئـەبێت بزانیـت عیبادەتەکان چین و بە چی ئەپەرسترێت.

٢. حەرامە لە خۆتەوە شت دابهێنیت و بڵێیت عیبادەتە.

٣. بەشـێك لـە عیبادەتـەکان واجـبن لەسـەرت و واجبیشـە چـۆنییەتی ئەنجامدانیان بزانیت.

٤. واجبـە مامەڵـە و گرێبەسـتە شـەرعییەکان بزانیـت و پێیانـەوە پەیوەسـت بیت، وە خۆت دوور بگریت لە حەرامەکانیان.

٥. خوای گەورە سنووری داناوە و حـەڵاڵ و حـەرامی دیـاریکردووە، وە ئـەبێت سنوورەکانی خوای گەورە بزانیت هەتاوەکو نەیانبەزێنیت.

٦. خوای گەورە شـەریعەتی داڕشـتووە و فـەرزیکردووە کـە بـە شـەریعەتەکەی حوکم بکرێت.

٧. واجبە موسوڵمانان ئیمامیان هەبێت و بە کتێبی خوا حوکمیان بکات.

٨. واجبە بـە دادپـەروەری حـوکم بکـەیت لـەنێوان لایەنـە ناکۆکەکانـدا و مـافی کەسیان نەخۆیت و نەهێڵیت کەسیش سنور ببەزێنێت.

٩. مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵ مافیان هەیە و نابێت مافیان بخۆیت.

# دووەم / پاكژی

## پاكژی چییە؟

پاكژی دوو شتە:

١. پاك و خاوێنی لەش و جل و جێ لە هەموو پیسی و گڵاوییەك.
٢. نەبوونی لەشگرانی و بوونی دەستنوێژ.

## ئاوی پاك كامەیە؟

ئەو ئاوەیە كە لەسەر سیفەتە بنەڕەتییەكانێتی و نەگۆڕاوە بە هیچ توخمێكی تر لە: تام و بۆن و ڕەنگ. وە بەو جۆرە ئەشێت بۆ لابردنی پیسی و هەڵگرتنی بێ نوێژی. وە ئاو بە گشتی بێ تام و بێ بۆن و بێ ڕەنگە، جگە لە ئاوی دەریا كە ئەگەرچی سوێریشە بەڵام هەر پاكە لە شەرعدا.

# دەستنوێژ چییە؟

دەستنوێژ ئەو عیبادەتەیە کە نوێژ بەبێ ئەو دروست نییە، کە شتنی کۆمەڵێك ئەندامی لەشە بە نییەتەوە بە ئاوی پاك بەم شێوەیە: ئاو ڕادان لە دەم و هەڵمژینی ئاو بە لووت و فڕێدانەوەی، پاشان شتنی ڕوخسار لە ناوچەوانەوە بۆ چەناگە وە لە گوێچکەی ڕاستەوە بۆ چەپ هەمووی، پاشان شتنی دەستەکان لە پەنجەکانەوە بۆ ئانیشك، پاشان سڕینی سەر بە هێنانی دەستەکان بە تەڕی پێیدا لە بنەڕەتی ناوچەوانەوە بۆ تەوقی سەر، وە سڕینی گوێچکەکان بە پەنجەی تەڕ، پاشان شتنی قاچەکان سەر و بنی لە پەنجەکانەوە تا قولەپێ.

وە شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ ئەشێ یەك یان دوو یان سێ جار بێت هەموویان وە لەوە زیاتر نابێت. وە سڕینی سەر تەنها یەك جارە لە هەموو حاڵەتێکدا. وە باشترە لای ڕاست پێشبخرێت لە شتنی دەست و قاچدا.



| سنووری ڕوخسار لە دەستنوێژدا | سنووری دەست لە دەستنوێژدا |
|---|---|



| سنووری پێ لە دەستنوێژدا | سنووری سەر لە دەستنوێژدا |
| --- | --- |

# ئەو شتانەی دەستنوێژ ئەشكێنن چین؟

دەستنوێژ شكێنەكان ئەمانەن:

١. هاتنەدەرەوەی با یان دەنگ (تس، تڕ).

٢. هاتنەدەرەوەی میز یان پیسایی.

٣. هاتنەدەرەوەی مەذی یان وەدی یان مەنی.

٤. هاتنەدەرەوەی خوێنی سوڕی مانگانە یان زەیستانی.

٥. دەستدان لە زەكەری خۆی بۆ نێر، وە زێی خۆی بۆ ئافرەت، بە بەركەوتنی پێست بە پێست بێ پۆشەر.

٦. خواردنی گۆشتی حوشتر.

٧. خەوتن.

# غوسڵ چییە؟

خۆشتنە بە نییەتی لابردنی بێنوێژی لە چەند حاڵەتێکدا بە یەکێك لەم شێوانە:

١. پاککردنەوەی عەورەت گەر پیسبوو، وە ئاوکردن بە هەموو لەشدا.

٢. شتنی عەورەت، پاشان شتنی دەستەکان، پاشان دەستنوێژگرتن، پاشان تەڕکردنی بنی مووەکانی سەر لەگەڵ پەنجەلێخستنی، پاشان سێ جار ئاو کردن بە سەردا، پاشان ئاوکردن بە تەواوی لەشدا بە پێشخستنی لای ڕاست.

# ئەو حاڵەتانە چین کە غوسڵ واجب ئەکەن؟

واجبکەرەکانی غوسڵ ئەمانەن:

١. هاتنەدەرەوەی مەنی.

٢. جیماع (ونکردنی سەری زەکەر لە زێدا).

٣. تەواو بوونی حەیز و زەیستانی (وەستانی دابەزینی خوێن).

٤. نوێژی جومعە بۆ کەسێك کە چڵکن و بۆن ناخۆش بێت.

٥. مردن.

# تەیەموم چییە؟

بەکارهێنانی زەوی پاك یان هەرشتێکە لە توخمی خۆی (گڵ، بەرد، لم) بۆ دەستنوێژ و غوسڵ لە بری ئاو، گەر ئاو دەستنەکەوت یان توانای گەشتن پێی یان بەکارهێنانیت نەبوو. بەم شێوەیە: لەپی دەستەکان ئەدات بە زەویدا بە نییەتی تەیەمومەوە، پاشان ڕوخساری ئەسڕێت پێیان وەك بۆ دەستنوێژ، پاشان هەردوو دەستی تا مەچەك بەیەك ئەسڕێت.

# کردەوەکانی فیترەت چین؟

سوننەتەکانی فیترەت ئەمانەن:

١. خەتەنەکردن.

٢. لێکردنەوەی مووی عەورەت.

٣. لابردنی مووی بنباڵ.

٤. بڕینی سمێڵ.

٥. هێشتنەوەی ڕیش.

٦. نینۆککردن.

٧. هەڵمژین و فڕێدانەوەی ئاو بە لووت.

٨. ئاو ڕادان لە دەم.

٩. سیواککردن.

١٠. شتنی چرچی پەنجەکان.

١١. تاراتکردن.

# کەی منداڵ باڵغ ئەبێت؟

گەر یەکێك لەم سیفەتانەی تیا دەرکەوت دوای فامکردنەوە و پێش پانزە ساڵی:

١. هاتنەدەرەوەی مەنی.

٢. هاتنی خوێنی سوڕی مانگانە.

٣. دەرکەوتنی مووی زبر لە دەوری دامێن.

وە گەر تەمەنی بوو بە پانزە ساڵ بە باڵغ حسابە ئەگەر هیچ کام لەو نیشانانەشی تیا دەرنەکەوتبوو.

# لەشگران چی لەسەر حەرامە؟

لەشگران ئەو کەسەیە کە غوسڵی لەسەر واجبە بەهۆی مەنی یان جیماع یان خوێنەوە. وە وەك لەش پاکە لە هەموو شتێکدا جگە لەمانە کە لێی حەرامن:

١. نوێژکردن.

٢. خوێندنەوەی قورئان و دەستدان لێی بەبێ پۆشەر.

٣. تەوافی کەعبە.

٤. ڕۆژوو و جیماع و مانەوە لە مزگەوت بۆ ئافرەت لە کاتی حەیز و زەیستانیدا.

# خواردنە پاك و حەڵاڵەکان کامانەن؟

ئەسڵ ئەوەیە هەموو خواردنەکان لە سەوزە و میوە و گۆشت و هی تر وە هەموو خواردنەوەکان پاك و حەڵاڵن، وە تەنها کەمێکیان حەرامکراون. وە حەرامەکان ئەمانەن:

١. هەموو ئاژەڵی مردارەوەبووی وشکانی جگە لە کولله.

٢. هەموو کەڵبەدارێك لە دڕندەکان.

٣. هەموو چڕنووکدارێك لە باڵندەکان.

٤. کەری ماڵی. بەراز.

٥. هەموو ئەو ئاژەلانەی واجبە یان حەرامە بکوژرێن.

٦. سەربڕدراو بۆ غەیری خوا. یان ئەوەی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە. یان ئەوەی بە ڕێی شەرعی سەرنەبڕدراوە. جگە لە سەربڕدراوی ئەهلی کیتاب.

٧. ئەوەی گلاوێکی خواردووە تا ناو سکی پاك ئەبێتەوە (الجلالة).

٨. ئەوەی لە گۆشتخوراو و گۆشت حەرامێك کەوتبێتەوە (بێچووی ئەسپ و کەری ماڵی).

**٩. خوێن جگە لە جگەر و سپڵی ئاژەڵی گۆشتخوراو.**

**١٠. هەموو سەرخۆشکەر و عەقڵبەرێك.**

**١١. هەموو زیانبەخشێك: جگەرە، تلیاك، ژەهر، نەوت.**

**١٢. هەموو گلاو یان گلاوبوویەك یان پیس و بێزراوێك.**

**١٣. مرۆڤ.**

# سێیەم / نوێژ

## نوێژ چییە؟

عیبادەتێکی خاوەن مەراسیمی دیاریکراوە، بە تەکبیر دەستپێئەکات و بە تەسلیم تەواو ئەبێت. وە موسوڵمان لە گشت شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ فەرزن لەسەری.

## نوێژە فەرزەکان کامانەن؟

پێنجن: نیوەڕۆ، عەسر، مەغریب، عیشا، سپێدە. وە هەریەکەیان کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە لە ڕۆژەکەیا. وە بەم جۆرە ئەکرێن:

١. سپێدە کە دوو رکاتە: دوای دەستنوێژ لە شوێنێکی پاکدا ڕووەو قیبلە بەپێوە نوێژخوێن ئەوەستێت بەرێکی و چاوی لەسەر جێی سوجدەکەیەتی، جا بە نییەتی نوێژی سپێدەوە دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە هەتا ئاستی شانی بە جۆرێك ڕووی دەستی لە قیبلە بێت و ئەڵێت: أَللّٰهُ أَكْبَرُ. پاشان دەستی چەپی ئەخاتە سەر سکی و دەستی ڕاستی ئەخاتە سەر دەستی چەپی، پاشان تەعەوذ ئەکات و سورەتی فاتیحە ئەخوێنێت و شتێك لە

قورئان ئەخوێنێت بەدوایدا، پاشان دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە هەتا ئاستی شانی وە ئەچێتە رکوع و بەدەم جووڵەوە ئەڵێت: ألله أكبر. وە لە رکوعدا ئەڵێت: سبحان ربي العظيم. پاشان لە رکوع هەڵئەستێتەوە و دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە تا شانی و لەگەڵ جووڵەدا ئەڵێت: سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد. وە ئەچێتەوە حاڵی پێشووی. پاشان دائەبەزێتە سوجدە بەبێ دەست بەرزکردنەوە و بەدەم دابەزینەوە ئەڵێت: ألله أكبر. وە ناوچەوان و لووتی و دەستەکانی و قاچی و ئەژنۆی ئەخاتە سەر زەوی، بە جۆرێك سەری پەنجەکانی قاچی ڕووەو قیبلە دائەنێت، وە ئەڵێت: سبحان ربي الأعلى. پاشان سەری بەرزئەکاتەوە و بەدەم جووڵەوە ئەڵێت: ألله أكبر، بێ دەست بەرزکردنەوە، وە قاچی چەپی ڕائەخات و لەسەری دائەنیشێت و قاچی ڕاستی (یان هەردووکیان) وەك حاڵەتی سوجدە ئەهێڵێتەوە و ئەڵێت: رب اغفر لي. وە لەم دانیشتنەدا دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دائەنێت. پاشان دووبارە بە هەمان شێوە ئەچێتەوە سوجدە لەگەڵ وتنی: ألله أكبر دا و زیکری سوجدە ئەخوێنێت. پاشان سەری بەرزئەکاتەوە و رکاتی یەکەمی تەواوکرد و هەڵئەستێتەوە بۆ رکاتی دووەم و بەدەم هەڵسانەوەوە ئەڵێت: ألله أكبر، بێ دەست بەرزکردنەوە. پاشان دووبارە هەمان قسە و کردارەکانی رکاتی یەکەم دووبارە ئەکاتەوە و، کاتێك لە دووەم سوجدە سەر هەڵئەبڕێت دائەنیشێت وەك لە نێوان دوو سوجدەکەدا (یان تورك ئەکات)

دانیشت وه دەستی چەپی ئەخاتە سەر ئەژنۆی چەپی و، بە پەنجە گەورە و پەنجـەی ناوەڕاسـتی دەسـتی ڕاسـتی بازنەیـەك دروسـت ئـەكات وە دوو پەنجەكـەی كۆتـایی پێكـەوە ئـەنووقێنێت، وە پەنجـەی شـایەتمانی بەرزئەكاتەوە ڕووەو قیبلە و دەستی ڕاستی لەسەر ئەژنۆی ڕاستی دائەنێت و ئەڵێت: التحيات لله والصلوات والطيبات، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، أللهم صل على محمد وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، إنك حميد مجيد، أللهم بارك على محمد وعلى آل محمد، كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد. پاشـان سـەری بـەلای ڕاسـتدا ئەسوڕێنێت و سـەیری لای ڕاسـتی ئـەكات و ئەڵێت: السلام عليكم ورحمة الله. ئینجا بەلای چەپدا و سەلام ئەداتەوە. وە بەمە نوێژەكەی تەواو ئەبێت. وە لە هەموو هەنگاوەكاندا لەسەرخۆ ئەبێت و پەلە ناكات. وە لە تەواوی نوێژەكەدا سەیری شوێنی سوجدەكەی ئـەكات جگە لە كاتی تەشەهود كە سەیری شایەتمانی ئەكات و چاوەكانی كراوەن.

٢. نیوەڕۆ و عەسر و عیشا كە چوار ركاتن: دوو ركاتی یەكـەم هـەمان شێوەی نوێژی سپێدەیە جگە لەوەی نییەتی نوێژەكە ئەگۆڕێت بەپێی نوێژەكە. وە دوو ركاتی تـری هاوشێوە بەدوایانـدا ئـەكات و لـە ركـاتی چوارەمدا سـەلام

ئەداتــەوە نــەك دووەم. وە کــە بــۆ رکــاتی ســێهەم هەڵئەســتێتەوە بــەدەم هەڵسانەوەوە لەگەڵ تەکبیڕدا دەستەکانیشی تا شانی هەڵئەبڕێت.

٣. مەغریب کە سێ رکاتە: دوو رکاتی یەکەم هـەمان شـێوەی نوێـژی سـپێدەیە جگـە لـەوەی بـە نییـەتی نوێـژی مەغریبـەوە ئـەیکات. وە رکـاتێکی تـری هاوشـێوەی دووەم بەدوایـدا ئـەکات و، لـە رکـاتی سـێهەمدا سـەلام ئەداتـەوە نـەك دووەم، وە کـە بـۆ رکـاتی سـێهەم هەڵئەسـتێتەوە لەگـەڵ تـەکبیڕدا دەستەکانیشی تا ئاستی شانی هەڵئەبڕێت.



| بەرزکردنەوەی دەستەکان تا ئاستی شان | دانانی دەستەکان لەسەر سك |
|---|---|
| روکوع | سوجدە |



| دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە | دانیشتنی نێوان سوجدەکان و تەشەهود |
| --- | --- |
| دەستەکان لەکاتی تەشەهوددا | سەلامدانەوە |

# نوێژی بەکۆمەڵ چییە؟

هەمان پێنج نوێژە فەرزەکانە و موسوڵمانان پێکەوە لە مزگەوتدا ئەیکەن نەك بەتەنیا. وە تەنها لەسەر پیاوان فەرزە جیا لە ئافرەتان. کە زاناترینیان بە نوێژ پاشان قورئانخوێنترینیان پێشیانئەکەوێت. وە موسوڵمانان لە دوایەوە ڕیزئەبن و لەگەڵی نوێژ ئەکەن و پێشی ناکەون و خۆشیانی لێ درەنگ ناخەن، وە گوێی لێ ئەگرن گەر قورئانی بە دەنگی بەرز خوێندەوە.

# نوێژی جومعە چییە؟

لە ڕۆژی جومعەدا موسوڵمانان لە مزگەوت کۆئەبنەوە لەکاتی نوێژی نیـوەڕۆدا و، دوای وتـار دوو رکـات ئەکـەن بـە کۆمـەڵ لـەبری چـوار رکـاتی نیـوەڕۆ. وە گـەر موسـوڵمانێك نوێـژی جومعـەی فـەوتا بـە جەماعـەت ئـەوا چـوار رکـاتی نیـوەڕۆ ئەکات، نەك نوێژی جومعە.

# نوێژی جەنازە چییە؟

ئەو نوێژەیە کە موسوڵمانان بەکۆمەڵ ئەیکەن بەپێوە لەسەر مردووی موسـوڵمان دوای شتن و کفنکردنی وە پێش ناشتنی. کە چوار تەکبیرە بە دەست هەڵبڕینەوە. وە لـە یەکەمـدا فاتیحـە ئـەخوێنرێت و لـە دووەمـدا صـەلات ئـەدرێت لەسـەر پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم، وە لـە سـێیەم بـەدواوە دوعـا بـۆ مردووەکـە ئەکرێت. وە یەك جار سەلام ئەدرێتەوە تیایدا بەلای ڕاستدا. وە سجود و رکوع و دانیشتنی نییە.

# جلی شەرعی چییە؟

ئەو بەرگە پاكەیە كە درێژ و ئەستوور و پانە و موسوڵمان ئەیكاتە بەری تا عەورەتی داپۆشێت. وە عەورەت دووانە و هەریەكە بە شێوەی خۆی دائەپۆشرێت:

١. عەورەتی بینین: ئەو بەشەی لەشە كە واجبە داپپۆشرێت لە چاوی نامەحرەم. كە بۆ ئافرەت هەموو لەشێتی. وە بۆ پیاو ناوك بۆ ئەژنۆیەتی.

٢. عەورەتی نوێژ: ئەو بەشەی لەشە كە لە نوێژدا ئەبێت داپپۆشرێت ئەگینا نوێژ بەتاڵە. كە بۆ ئافرەت هەموو لەشێتی جگە لە ڕوخسار و دەستەكانی گەر نامەحرەم نەیبینن. وە بۆ پیاو ناوك بۆ ئەژنۆیەتی.

# چوارەم / ڕۆژوو

## ڕۆژوو چییە؟

خۆگرتنەوەیە لە خواردن و خواردنەوە و جیماع، لە بانگی بەیانییەوە هەتا بانگی مەغریب بەمەبەستی ڕازیکردنی خوای گەورە.

## ڕۆژووی ڕەمەزان چییە؟

بەڕۆژووبوونە لە مانگی ڕەمەزاندا لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی مانگەکە. کە واجبە لەسەر هەموو نیشتەجێیەکی ساغ.

## کێن ئەوانەی ڕەمەزان بەڕۆژوو نابن؟

ئەو کەسانەی کە بۆیان هەیە ڕەمەزان بەڕۆژوو نەبن ئەمانەن:

١. ئافرەت لەکاتی سوڕی مانگانە و زەیستانیدا حەرامە بەڕۆژوو بێت، وە دوای ڕەمەزان کە پاك بووەوە ئەیانگرێتەوە (قەزا).

٢. نەخۆشێك كە ڕۆژوو زیانی بۆی هەبێت بەڕۆژوو نابێت و كە چاك بووەوە قەزای ئەكات. وە گەر ئومێدی باشبوونی نەبوو ئەوا كەفارەت ئەدات لەبری هەر ڕۆژێك (فیدیە).

٣. پیرێك كە توانای نەبێت بەڕۆژوو نابێت و فیدیە ئەدات بۆ هەر ڕۆژێك.

٤. ئافرەتی سكپڕ یان شیردەر لەبەر تەندروستی خۆی یان منداڵەكەی ئەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت، و دواتر قەزای ئەكات. وە گەر لەبەر تەندروستی منداڵەكە بوو بەتەنها ئەوا قەزا و كەفارەت ئەدات بۆ هەر ڕۆژێك.

٥. موسافیڕ هەتا ئەگەڕێتەوە بۆی هەیە بەڕۆژوو نەبێ و دواتر قەزای ئەكات.

وە كەفارەتی ڕۆژوو (فیدیە) پێدانی نیو صاع (دوو مشتی هەردوو دەست) خواردنی سەرەكی ناوچەكەیە بە هەژارێك بۆ هەر ڕۆژێك كە خواردوویەتی.




یەك صاع چوار مشتە

# جەژنەکان کامەن؟

جەژنەکانی موسوڵمانان ئەو ڕۆژانەن کە دەقەکان بە جەژن دایاننناون. ئەوانیش:

١. جەژنی بەربانگکردنەوە لە رەمەزان (جەژنی رەمەزان). کە یەکی مانگی شەوواله و یەك ڕۆژە.
٢. جەژنی قوربانیکردن (جەژنی قوربان). کە دەی ذیلحیججە و سێ ڕۆژی دواترە (یانزە و دوانزە و سیانزە) و بە هەمووی چوار ڕۆژە.
٣. ڕۆژی جومعان لە حەفتەکەدا.

سوننەتە شەوانی جەژن بە عیبادەت زیندووبکرێتەوە. وە جەژنی رەمەزان و قوربان نوێژی جەژنیان تیا ئەکرێت. وە لە جەژنی رەمەزان و قورباندا خواردن ئەخورێت و ڕۆژوو حەرامە، وە تیایانا بە دەنگی بەرز تەکبیرات ئەکرێت، وە خۆشحاڵی دەرئەبڕدرێت.

# ئیعتیکاف چییە؟

مانەوەیە لە مزگەوتدا بە مەبەستی رازیکردنی خوای گەورە لە هەر مانگێکدا بەتایبەت رەمەزان. وە زۆرتین ماوەی دیاریکراو نییە، وە کەمترینی شەوێك یان ڕۆژێکە. وە بە چوونەدەرەوە بێ زەرورەت و جیماع بەتاڵ ئەبێت.

# پێنجەم / زەکات

## زەکات چییە؟

دەرکردنی بڕێکی دیاریکراوە لە ئاڵتوون و زیو و مەڕ و بزن و گا و مانگا و حوشتر، گەر گەشتبنە بڕێکی دیاریکراو (نصاب) و دواتر ساڵێکی کۆچییان بەسەردا سوڕابێتەوە و لە نیصابدا مابنەوە. وە هەروەها دەرکردنی بڕێکی دیاریکراوە لە چەند جۆرێکی ڕوواوی زەوی لەکاتی کۆکردنەوەی بەر و بوومەکەدا گەر گەشتبووە نیصاب. وە دەرکردنی بڕێکی دیاریکراوە لە هەر شتێك کە بۆ بازرگانی و فرۆشتن دانراوە و نرخەکەی یەکسانە بە نیصابی زێڕ یان زیو دوای سوڕانەوەی ساڵ بەسەریدا.

| جۆری زەکات | نیصاب | بڕی زەکات |
|---|---|---|
| زێڕ | ٨٥ گرامی عەیارە ٢٤ | یەك لە چل (٠,٠٢٥) |
| زیو | ٥٩٥ گرامی خاوێن | یەك لە چل (٠,٠٢٥) |
| مەڕ و بزن | ٤٠ سەر | بەپێی خشتەی خۆیەتی |
| گا و مانگا | ٣٠ سەر | بەپێی خشتەی خۆیەتی |
| حوشتر | ٥ سەر | بەپێی خشتەی خۆیەتی |

| دەرهاتووی زەوی | ٣٠٠ صاع (٧٥٠ كیلۆگرام) | یەك لە بیست یان یەك لە دە (بە مەرجی خۆی) |
|---|---|---|
| نمایشكراوی بازرگانی | ٨٥ گرام زێڕی عەیارە ٢٤ | یەك لە چل (٠,٠٢٥) |
| پارەی كاغەز | ٨٥ گرام زێڕی عەیارە ٢٤ | یەك لە چل (٠,٠٢٥) |

# زەكات بە كێ ئەدرێت؟

زەكات تەنها بەم هەشت پۆلە ئەدرێت:

١. فەقیر.

٢. هەژار (مسكین).

٣. زەكات كۆكەرەوەی دەسەڵاتی موسوڵمان.

٤. دڵڕاگیراو (تازە موسوڵمان).

٥. كۆیلە تا خۆی پێ بكڕێتەوە.

٦. قەرزار.

٧. موجاهید تا یارمەتی بدرێت لە جیهادەكەیدا (لەپێناو خوا).

٨. ڕێبوارێك كە پارەی لێ بڕاوە.

# سەرفترە چییە؟

بەخشینی چوار مشت (صاعێك) خواردنە لە خواردنی ناوچەکە بە فەقیر و هەژار، لە دوو ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا هەتا نوێژی جەژنی ڕەمەزان، ساڵانە لەلایەن هەر موسوڵمانێکەوە کە لە بڕی ڕۆژێك زیاتر خواردنی هەبێت.

# خێر چییە؟

بەخشینی سامانە لەلایەن خاوەنەکەیەوە بە فەقیر و هەژار و قەرزار و موحتاجان، بە ویستی خۆی بێ ئەوەی لەسەری واجب بێت.

# شەشەم / حەج

## حەج چییە؟

عیبادەتێکی دیاریکراوە کە لە شاری مەککە ئەکرێت لە مانگەکانی حەجدا (شوال، ذو القعدة، ذو الحجة)، کە واجبە لەسەر هەموو کەسێك یەك جار لە تەمەنیدا. بەم شێوەیە: گەر توانای ماددی هەبوو بۆ سەفەر وە لەشساغ بوو وە توانای هەبوو بە سەلامەتی بگاتە مەککە، ئەوا سەفەری بۆ ئەکات لە مانگەکانی حەجدا، وە گەر گەشتە یەکێك لەم شوێنانەی چواردەوری شاری مەککە (ذو الحليفة، عرق، يلملم، جحفة، قرن) غوسڵ دەرئەکات و، گەر پیاو بوو جلی ئیحرام لەبەرئەکات، پاشان لەو جێیە بە نییەتی حەجەوە ئەڵێت: لبيك اللهم حجا. پاشان زیکری تەلبیە دووبارە ئەکاتەوە هەتا ئەگاتە کەعبە: لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك. پاشان حەوت جار بە دەوری کەعبەدا ئەسوڕێتەوە، مەگەر ئافرەت لە کاتی حەیزدا بێت تەواف ناکات. پاشان ئەچێتە پشت مەقامی ئیبراهیمەوە و ڕووەو قیبلە دوو رکات نوێژ ئەکات. پاشان بەرەو کێوی صەفا ئەڕوات و تەوافی صەفا و مەروە ئەکات حەوت سەر. پاشان لە

ڕۆژی هەشتەم (٨)ی مانگی ذو الحجة (يوم التروية) ئەچێت بۆ مینا و لە نیوەڕۆوە هەتا خۆرهەڵاتنی نۆ (٩)ی ذي الحجة لەوێ ئەبێت، پاشان ئەڕوات بۆ عەرەفە و تا خۆرئاوابوون لێی ئەمێنێتەوە. دواتر ئەچێت بۆ موزدەلیفە و شەو لێی ئەمێنێتەوە کە دە (١٠)ی ذي الحجةیە و شەوی جەژنە. پاشان یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان (١٠ ذو الحجة) دوای نوێژی بەیانی ئەچێت بۆ مینا و حەوت بەرد ئەهاوێت لە جمرة العقبة و لەگەڵ هەر هەڵدانێکدا ئەڵێت: الله أكبر. وە دواتر گەر حەیوانی پێبێت سەری ئەبڕێت و گۆشتەکەی دابەش ئەکات و لێی ئەخوات. پاشان قژی کورت ئەکاتەوە، وە پیاو باشترە بیتاشێت. پاشان ئەگەڕێتەوە کەعبە و تەوافی ئەکات (طواف الإفاضة) وە دوو رکات لە پشت مەقامی ئیبراهیم ئەکات و سەعی صەفا و مەروە ئەکات. وە شەوەکانی یانزە و دوانزە و سیانزە (١١، ١٢، ١٣)ی ذي الحجة لە مینا ئەمێنێتەوە کە دووەم و سێهەم و چوارەم ڕۆژی جەژنن، وە لە ڕۆژەکانیان بەردەکان فڕێئەدات (رمي الجمرات). وە بەمە لە حەجەکەی تەواو ئەبێت. وە هەرکاتێك ویستی مەککە بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی ئەوا کۆتا کار تەوافی کەعبە ئەکات (طواف الوداع).

وە تەلبیە لە میقاتەکان دوو شێوەی تریشی هەیە: لبيك اللهم حجا وعمرة (قارن)، لبيك اللهم عمرة متمتعا بها إلى الحج (متمتع). کە لەگەڵ حەجەکەدا عومرەیەك ئەکات و لە تەمەتوعدا تەواوی ئەکات پاشان حەج ئەکات، وە لە قاریندا لێی حەڵاڵ نابێتەوە و حەجەکەشی پێوە ئەکات. وە تیایاندا خوێنێکی

لەسەرە (هدي) و گەر نەیتوانی قوربانی بکات دە ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت سێی لە حەج و حەوتیش کە گەڕایەوە.




میقاتەکانی ئیحرام




کەعبە و مەقام و صەفا و مەروە




نەخشەی نوسوکەکان

# عومره چییه؟

عیبادەتێكی دیاریكراوە كە لە هەر مانگێكی ساڵدا ئەكرێت لە مەككە. بەم شێوەیە: بە نییەتی عومرەوە لە یەكێك لە پێنج میقاتەكەی مەككە دوای غوسڵ و جلی تایبەت بۆ پیاو، ئەڵێت: لبيك اللهم عمرة. پاشان زیكری تەلبیە ئەڵێت هەتا ئەگاتە كەعبە، وە تەوافی كەعبە ئەكات، پاشان دوو ركات لە پشت مەقامەوە ئەكات، پاشان سەعی صەفا و مەروە ئەكات، وە لە كۆتاییدا قژی ئەبڕێت یان ئەیتاشێت بۆ پیاوان.

# چی حەرامە لەسەر حاجی لەماوەی حەج و عومرەدا؟

لە كاتی وتنی تەلبیەی حەج یان عومرەوە لە میقاتەكان، هەتا حەڵاڵبوونی بە تاشین یان كورتكردنەوەی قژی لە عومرەدا، یان ئەنجامدانی جەمرەی عەقەبە و قژبڕین لە حەجدا (التحلل الأول)، ئەمانە لەسەری حەرامن:

١. لەبەركردنی جلێك كە بەگوێرەی ئەندامەكانی لەش دوردرابێت بۆ پیاوان.
٢. داپۆشینی سەر بۆ پیاوان.
٣. داپۆشینی ڕوخسار و دەست بۆ ئافرەتان.

٤. عەتر لەخۆدان.

٥. لێکردنەوەی مووی لەش.

٦. نینۆککردن.

٧. ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی.

٨. جووتبوون و خۆڕەحەتکردن.

٩. مارەکردن و داخوازی.

وە لە حەجدا جووتبوون هەر لەسەری حەرامە هەتا تەوافی ئیفازەش ئەکات (طواف الإفاضة، طواف الحج) (التحلل الثاني). وە ئەوەی حەرامکراوەکان بکات بە عەمدی و بزانێت ئەوا فیدیەی لەسەرە. بەم جۆرە:

- گەر حەرامکراوێکی کردبوو جگە لە جووتبوون ئەوا ئەبێت یەکێك لەم سیانە بکات بە ویستی خۆی: ڕۆژووی سێ ڕۆژ، خواردنی شەش هەژار (نیو صاع)، حەیوانێك بۆ هەژاران (بزن، مەڕ، مانگا، حوشتر).
- گەر جووتبوون بێت پێش تەحەلولی یەکەم ئەوە فیدیەی لەسەرە و حەجەکەی بەتاڵ بووەتەوە و ساڵێکی تر ئەبێت حەجەکەی بکاتەوە.
- گەر جووتبوون بێت دوای تەحەلولی یەکەم و پێش دووەم ئیحرامەکەی نوێ ئەکاتەوە لە میقات و خوێنێکی لەسەرە (حەیوانێك).

# قوربانی چییه؟

ئەو ئاژەڵە ساغ و سەلامەتەیە کە لە دوای نوێژی جەژنی قوربانەوە تا ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن سەرئەبڕدرێت بە نییەتی قوربانییەوە. کە ئەمانەن:

١. حوشترێك کە پێنج ساڵی تەواوکردبێت.

٢. مانگایەك دوو ساڵی تەواوکردبێت.

٣. مەڕێك شەش مانگی تەواوکردبێت.

٤. بزنێك ساڵێکی تەواوکردبێت.

وە ئاژەڵی کوێر (چاوێکی یان هەردووکی) یان نەخۆش یان شەل (دەست یان قاچ شکاو) یان سیس و لاواز بۆ قوربانی ناشێن. وە غەیری ئەو جۆرانە و کەمتر لەو تەمەنانەیان بۆ قوربانی ناشێن. وە لە غەیری ئەو کاتەدا قوربانی نییە.

وە قوربانی سوننەتە. وە مەڕ یان بزنێك بۆ ماڵێکی تەواو ئەبێت. وە مانگا یان حوشترێك بۆ حەوت ماڵ ئەبێت پێکەوە. وە ئەو کەسەی قوربانی بکات سوننەتە لێی بخوات. وە قوربانیکەر نینۆك و موو لەخۆی ناکاتەوە لە دەستپێکی مانگی ذي الحجةوە تا قوربانییەکە ئەکات.

# حەوتەم / جیهاد

## جیهاد چییە؟

شەڕی کافرانە بۆ بڵاوکردنەوە و سەرخستنی ئیسلام دوای ئەوەی کافران ڕازی نەبوون بە وازهێنان لە نەفامی و زوڵمەکەیان و وەرگرتنی ئیسلام، یان بە مانەوەیان لەسەر کوفرەکەیان لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا و دانی جیزیە.

وە بەرپەرچدانەوەی کافرانە کاتێك هێرش ئەکەنە سەر موسوڵمانان و ناوچەکانیان.

## شەهید کێیە؟

ئەو موسوڵمانەیە کە لە پێناو خوادا ئەکوژرێت. وە دەقەکان چەند مردوویەکی تری موسوڵمانیان بە شەهید وەصف کردووە، کە ئەمانەن:

١. بە تاعوون مردوو.

٢. بە دەردەسك مردوو.

٣. خنكاو له‌ ئاودا.

٤. مردن به‌هۆی دارِمانه‌وه‌.

٥. مردن به‌هۆی نه‌خۆشی سییه‌وه‌ (ئیلتیهابی سی).

٦. سووتاو به‌ ئاگر.

٧. ئافره‌تی دووگیان.

٨. دیفاعکه‌ر له‌ سامانی خۆی گه‌ر له‌سه‌ری بکوژرێت.

٩. کوژراو له‌سه‌ر خوێنی خۆی.

١٠. کوژراو له‌سه‌ر شه‌ره‌ف و خێزانی خۆی.

وه‌ مردن له‌سه‌ر ڕه‌گه‌زپه‌رستی و له‌ ژێر ئالأی کوێرانه‌دا مردنێکی نه‌فامییه‌ وه‌ شه‌هیدبوونی تیا نییه‌. وه‌ شه‌هیدی جیهاد پله‌ی له‌وانی تر به‌رزتره‌.

# زیممییه‌کان کێن؟

ئه‌و کافرانه‌ن که‌ له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئیسلامدا ئه‌ژین و له‌سه‌ر دینی خۆیانن و په‌یمانیان هه‌یه‌ له‌گه‌ڵ موسوڵمانان‌دا، وه‌ جیزیه‌ ئه‌ده‌ن و ئه‌پارێزرێن.

# گیراوی کافر له‌ شه‌ڕدا حوکمی چییه‌؟

ژن و منداڵیان کۆیله‌ن. وه‌ نێری باڵغی شه‌ڕکه‌ر یه‌کێك له‌ چوار حوکمی هه‌یه‌.

# هەشتەم/ مامەڵەکان

## مامەڵەکان چین؟

ئەو هەڵسوکەوتە دنیاییانەن کە لە نێوان خەڵکدا ڕووئەدەن. لە: فرۆشتن، کرێ، قەرز، ڕەهن، وەکالەت، شەریکایەتی، ئەمانەت، میراتی، وەقف وە هی تر.

## فرۆشتن چییە؟

گۆڕینەوەی سامانە بە سامان لەلایەن خاوەنەکەیانەوە بە دەستەواژەی دیاریکراو. وەك: پارەی کاغەز بە نان، میوە بە گۆشت، ئاڵتوون بە گەنم.

## کرێ چییە؟

گۆڕینەوەی سامانە بە سوودێکی کاتی. وەك: پارەی کاغەز بە نیشتەجێبوون لە خانوویەك بۆ ساڵێك، پارەی کاغەز بە سواربوونی سەیارە تا گەشتنە جێیەك.

# قەرز چییە؟

دانی سامانە بە کەسێك سوودی لێ ببینێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و وەرگرتنەوەی هاوشێوەکەی لە جۆر و بڕدا دوای ماوەکە لەلایەن خاوەنەکەیەوە. وەك: دانی سەد دینار بە کەسێك بۆ دوو مانگ و وەرگرتنەوەی سەد دینار لێی دوای کۆتایی ماوەکە، دانی دوو صاع برنجی کوردی بۆ ساڵێك و وەرگرتنەوەی دوو صاع برنجی کوردی دوای ماوەکە.

وە هەر موڵکێك غەیری خاوەنەکەی مامەڵەی پێوە بکات بۆ مەسڵەحەتی خۆی قەرزە. وەك: مامەڵەکردنی بانك بە پارەی دانراوی خەڵکەوە لەلای بۆ مەسڵەحەتی غەیری خاوەنەکەی.

وە هەر قەرزێك سوود (زیادە، قازانج) بچێتە سەری لەکاتی گەڕانەوەیدا ئەوا سوودەکە ریبایە کەم بێت یان زۆر. وەك: دانی سەد دینار و وەرگرتنەوەی سەد و یەك دینار، دانی بزنێکی دوو ساڵ و گێڕانەوەی مەڕێکی دوو ساڵ، دانی مسقاڵێك ئاڵتوونی عەیارە هەژدە و گێڕانەوەی مسقاڵێکی عەیارە بیست و یەك.

# ڕەهن چییە؟

دانـانی سـامانە وەك بارمتـە لـە پـای قەرزێكـدا تـا قەرزەكـە ئەدرێتـەوە لەلایـەن قەرزكەرەكەوە، بەو مەرجەی نرخی بارمتەكە یەكسان یـان زیـاتر بێـت لـە بـڕی قەرزەكە. بە شێوەیەك گەر توانای دانـەوەی قەرزەكـەی نـەبوو دوای تـەواوبوونی ماوەی قەرزەكە ئەوا بارمتەكە ئەفرۆشرێت و قەرزەكەی لێ ئەدرێتـەوە. وە هـەر موڵكی خاوەنەكەیەتی تا ئەفرۆشرێت. وەك: دانانی خانوویەك وەك بارمتە كە لە بازاڕدا نرخەكەی شەش دەفتـەرە لەسـەر قـەرزكردنی پێـنج دەفتـەر تـا دانـەوەی، دانانی سەیارەیەك كە نرخەكەی دوو دەفتەرە لە بازاڕدا وەك بارمتە تـا دانـەوەی دوو دەفتەر قەرز.

# وەكالەت چییە؟

ڕێپێـدانی خـاوەن موڵكـە بـە كەسـێك كـە مامەڵـە بكـات بـە موڵكەكانیـەوە بـۆ مەسڵەحەتی خاوەن موڵكەكە.

# شەریكایەتی چییە؟

كاركردنی دووان یـان زیـاترە پێكـەوە لـە كارێكـدا، كـە هەریـەكێك بـە شـتێك یـان چەند شـتێك بەشـدارە تیایـدا (پـارە، كـاركردن، ناوبـانگ). كـە لەسـەر ڕێژەیـەكی

دیاریکراوی قازانج ڕێکئەکەون (نیوە، سێ یەك، سەدا سێ)، وە لە زەرەرکردندا هەریەکە بەپێی بەشداریکردنەکەی لە شەریکایەتییەکەدا زەرەر ئەکات. وەك: دووان دووکانێك دائەنێن یەکێکیان بە پارە بەشدارە و ئەوی تر بە ئیشکردن لەسەری وە قازانج بە نیوەیی بەش ئەکەن. وە بەشداربووەکە بە پارە زەرەر لە پارەکەیا ئەکات و ئەوی تر زەرەری پارە ناکات. سیان شەریکەیەك دائەنێن یەکێکیان نوسینگە و کۆگاکە دابین ئەکات یەکێکیان کاڵاکان ئەهێنێت یەکێکیشیان ناوبانگی بەکاردێنێت بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکان، وە یەکەم سەدا چل و دووەم سەدا سی و پێنج و سێیەم سەدا بیست و پێنج قازانج ئەبات. وە یەکەم لە کۆگا و نوسینگەکەدا زەرەر ئەکات و دووەم لە کاڵاکاندا و سێهەم زەرەر ناکات لەوانەی پێشوودا.

# نۆیەم/هاوسەرگیری

## هاوسەرگیری چییە؟

گرێبەستێکی شەرعییە کە نێر و مێیەك لە یەکتر حەڵاڵ ئەکات. وە ئەولاترە هاوسەرگیری لەگەڵ دیندار و بە ڕەوشت و هاوشاندا بکرێت.

## مەرجەکانی هاوسەرگیری چین؟

مەرجەکان بۆ دروستبوونی گرێبەستی هاوسەرگیری ئەمانەن:

١. هەردوو هاوسەرەکە دیار و دیاریکراو بن، وە نادیار نەبن لەوی تر.

٢. نەبوونی ڕێگری شەرعی. وەك: مەحرەمی بە نەسەب یان شیر.

٣. ڕازیبوونی هەردوو کەسەکە.

٤. ڕەزامەندی وەلی ئەمری ئافرەتەکە.

٥. دانی مارەیی بە ئافرەتەکە لەلایەن پیاوەکەوە.

٦. بوونی دوو شایەتی داد یان ئاشکراکردنی گرێبەستەکە بۆ خەڵك.

# فرەژنی چییە؟

بوونی زیاتر لە ئافرەتێکە لەلایەن پیاوێکەوە وەك هاوسەر لە هەمان کاتدا. کە نابێت لە چوار ئافرەت زیاتر بن، یان دوو خوشك پێکەوە بن لە هەمان کاتدا، وە پوور و خوشکەزا یان پوور و برازا نەبن پێکەوە. وە پیاوەکە ئەبێت دادپەروەری بکات لەنێوانیاندا لە بابەتە ڕووالەتییەکاندا. وە بە هەمان مەرجەکانی هاوسەرگیرییە.

# خولع چییە؟

داوای ژنە بۆ جیابوونەوە لە مێردەکەی لەبەر هۆیەکی شەرعی لەلای حاکم، کە گەر حاکم داواکەی بە ڕەوا بینی جیایان ئەکاتەوە و مارەییەکە ئەداتەوە بە پیاوەکە.

# تەڵاق چییە؟

هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییە لەلایەن پیاوەوە بە دەربڕینی دەستەواژەی تایبەت بە نییەتی جیابوونەوەوە. کە هەر پیاوێك سێ تەڵاقی هەیە بەرامبەر هەر ژنێکی.

وە گەر یەك یان دوو تەڵاقی خستبوو ئەوا بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە لە ماوەی عیددەی ئافرەتەکەدا، وە گەر عیددەی تەواو ببوو ئەتوانێت مارەی بکاتەوە بە عەقدی تازە. وە گەر هەرسێکی خست ئەوا بۆی نییە ژنەکە بگێڕێتەوە یان مارەی بکاتەوە هەتا شوو بە پیاوێکی تر ئەکات و لێی جیائەبێتەوە و عیددەی تەواو ئەکات لێی.

# عیددە چییە؟

گەر ئافرەت جیابووەوە لە مێردەکەی یان مێردەکەی مرد ئەوا واجبە لەسەری ماوەیەك چاوەڕێ بکات کە مێردەکەی بیگێڕێتەوە لای خۆی گەر بۆی هەبوو، وە دوای تەواوبوونی ماوەکە ئینجا ئەتوانێت شوو بکات بە کەسێکی تر.

وە ماوەی عیددە بەم شێوەیە:

| حاڵی ئافرەتەکە | ماوەی عیددە |
|---|---|
| سکدار | تا دانانی سکەکەیەتی |
| تەڵاقدراو دوای گواستنەوەی | سێ جار کەوتنە سووڕی مانگانەیە |
| تەڵاقدراو پێش گواستنەوەی | عیددەی نییە |
| جیابووەوە بە خولع | یەك جار کەوتنە سووڕی مانگانەیە |
| جیابووەوە بە فەسخ | یەك جار کەوتنە سووڕی مانگانەیە |
| مێرد مردوو | چوار مانگ و دە ڕۆژە |

# کەفارەتی سوێند چییە؟

ئەسڵ لە سوێندخواردندا کەراهەتە. وە دوای سوێند واجبە پابەندی ببێت. وە گەر پێچەوانەی سوێندەکەی بوو کەفارەتی لەسەرە. کە یەکێکە لەمانە بە ویستی خۆی:

١. خواردندان بە دە هەژار. بە بڕی ژەمێك خواردن بۆ هەر هەژارێك.
٢. داپۆشینی دە هەژار. بە جۆرێك کە بەشی داپۆشینی عەورەتی نوێژ بکات.
٣. ئازادکردنی کۆیلەیەك.

وە گەر هیچ کام لەوانەی نەتوانی ئەوا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت.

# دەیەم/تاوانەکان

## تاوانەکان چین؟

ئەو حەرامانەن کە شەرع بە تاوانی داناون و زەرەریان هەیە بۆ سەر نەفس (کوشتن، بریندارکردن) یان سامان (دزی، زەوتکردن) یان شەرەف (داوێنپیسی، تۆمەتبارکردن بە داوێنپیسی)، یان دین (هەڵگەڕانەوە).

وە شەرع سزای داناوە لەسەر تاوانەکان. وە حاکم دایانئەبەزێنێت لەسەر تاوانباران (قیصاص، تەعزیر) دوای چەسپینی تاوانەکە لەسەریان.

| تاوان | سزا شەرعییەکەی |
|---|---|
| کوشتن | قیصاصە (کوشتنەوە) لە کوشتنی ئەنقەستدا گەر هەموو کەسوکاری کوژراوەکە ویستیان یان دییەیە (بڕێك حوشتر یان ئاڵتوون بڕەکەی بەپێی حاڵی کوژراوەکە جیاوازە) یان لێخۆشبوونە، وە لە کوشتنی هەڵەدا کەفارەت (کۆیلەیەك یان گەر نەبوو ڕۆژووی دوو مانگ) و دییەیە بە کەسوکارەکەی گەر هەموویان ویستیان یان لێخۆشبوونە |
| بریندارکردن یان | قیصاصە (چاو بە چاو، ددان بە ددان) لە ئەنقەستدا گەر |

| فەوتاندنی ئەندامی لەش | کەسەکە داوایکرد، وە دییەیە (بڕەکەی بەپێی زەرەرەکەیە) لە هەڵەدا گەر کەسەکە داوایکرد یان لێخۆشبوونە |
|---|---|
| داوێنپیسی | کوشتنە لە نێربازیدا، وە سەد جەلد و بەردبارانکاردنە تا مردن بۆ نێر و مێیەك پیاو و ژن بن، وە سەد جەلد و دەرکردنە لە ناوچەکەیان تا ساڵێك بۆ نێر و مێیەك کوڕ و کچ بن |
| تۆمەتبارکردن بە داوێنپیسی | هەشتا جەلد و کەوتنی دادپەروەرییە گەر چوار شایەتی دادی نەبێت کە بە چاویان داوێنپیسییەکەیان دیبێت (زەکەری پیاوەکە لە زێی ئافرەتەکەدا وەك کلیل لە قفڵدا) |
| بەکارهێنانی سەرخۆشکەر | چل یان هەشتا جەلدە، وە مەرج نییە ئەوەی کە بەکاریهێناوە بێهۆشی کردبێت، وە هەموو بێهۆشکەرێك ئەگرێتەوە بخورێت یان بخورێتەوە یان هەڵبمژرێت |
| دزی | بڕینی دەستی ڕاستی تا مەچەك گەر قیمەتی دزراوەکە گەشتبووە نیصابی بڕین (چارەکێك دیناری ئاڵتوون ١,٠٦٢٥ گم عەیارە ٢٤)، وە گەر دووەم دزی بوو کە بڕینی تیابێت وە دەستی بڕدرابوو لە یەکەم جاردا نیوەی پێی چەپی ئەبڕدرێت بەبێ پاژنەکەی، وە گەر سێیەم جاری بوو سجن ئەکرێت |

# یانزەیەم/دادوەری

## دادوەری چییە؟

ڕوونکردنەوە و جێبەجێکردنی حوکمە شەرعییەکان و پابەندکردنە پێیانەوە، وە نەهێشتنی ناکۆکییە لەنێوان لایەنەکاندا. لەلایەن حاکمی شەرعییەوە دوای گوێگرتن لە لایەنەکان و ڕووانین لە بەڵگەکان و بیستنی شایەتەکان.

## دادوەر کێیە؟

موسوڵمانێکی نێری بەرپرسیاری زانای لەخواترسی داد (عدل)ی چاوساغی بیسەری قسەکەرە، کە ئیمامی موسوڵمانان دایناوە بە حاکم لە جێیەکدا بە دەسەڵاتێکی دیاریکراوەوە، وە بە شەرع حوکم ئەکات لەنێوان خەڵکدا.

## شایەت کێیە؟

ئەو کەسە دادەیە کە حازری ڕووداوێك بووە و بینیویەتی بە چاوی یان بیستوویەتی بە گوێی و وەك خۆی لەبیریەتی و لەبەردەم حاکمدا ئەیگێڕێتەوە.

# دووانزەیەم/خیلافەت

## خیلافەت چییە؟

جێگرەوەیی (لەبریی) پێغەمبەری خوایە صلی اللە علیە وسلم لە پاراستنی دین و بەڕێوەبردنی دنیادا. وە بە جێگرەوەکە ئەوترێت: خەلیفە، ئەمیر، ئیمام، سوڵتان، وەلی ئەمر.

وە واجبە موسوڵمانان خەلیفەیان هەبێت و بە شەرع حوکمیان بکات.

## خەلیفە کێیە؟

ئەو موسوڵمانە قورەیشییە نێرە خاوەن تەکلیفە دادە زانا لەشساغە ئازایەیە کە دەستەی گرێدان و هەڵوەشاندن (أهل العقد والحل) هەڵیانبژاردووە و بە قورئان حوکم ئەکات. وە موسوڵمانان گوێرایەڵین لە چاکەدا مادەم خیلافەتەکەی دروستە. وە قازی و وەزیر و ئەمیر بۆ سەر ناوچەکان دائەنێت بەپێی پێویست. وە حەج و جیهاد ئەکات و پێشنوێژی موسوڵمانان ئەکات.

# دەستەی گرێدان و هەڵوەشاندنەوە کێن؟

نێرینەی دادی زانا کامڵەکانی موسوڵمانانن کە گونجاوترین دیاریئەکەن بۆ ئیمامەت کە بتوانێت مەسڵەحەتی دین و دنیای موسوڵمانان بپارێزێت. وە هاوکاری ئەبن لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا و ئیمام ئەگەڕێتەوە بۆ لایان لە پرسەکاندا. وە ئیمام لائەبەن لە دەسەڵات گەر بە مەسڵەحەتی بزانن.

دەروازەیەك بۆ فیقه تەواو بوو والحمد لله رب العالمين

خوای گەورە قبوڵی بکات و بەرەکەتی تێ بخات

## ناوەڕۆك

دەیەم تاوانەکان



یانزەیەم دادوەری



دوانزەیەم خیلافەت